# لە پێشوازی مانگی ڕەمەزان

وتاری مامۆستا :

إسماعیل سووسەیی {خودای گەورە ئازادی بکات}

نووسینەوەی :

احـــــمــــــد

١٤٤٥

# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَسْتَهْدِية وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، أَرْسَلَ اللهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ،

أمَّا بَعْدُ

فإنَّ أصدق الحديث كلامُ الله، وخيرَ الهدي هديُ محمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلَّم، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعة ضلالة، وكلَّ ضلالة في النار

اللَهُمَ الطَّهِر قُلُبَنَا مِنَ الشُّبُهَاتِ وَالشَّهَوَاتْ وَأَعْمَالَنَا مِنَ الرِّياءْ

ثم أمَّا بَعْدُ ، بەڕێزان خۆشەویستان بەبۆنەی هاتنەوەی مانگی ڕەمەزان زۆر خۆشحاڵ و بەختەوەرین وە شووکرانە بژێرین لەسەر ئەو نیعمەتەی خودای پەروەرگار لەگەڵ ئێمەی کرد کە جارێکی تر گەیشتینەوە ئەو مانگە پڕ خێر و

بەپیت و بەرەکەتەی ، داوا لەخودای پەروەردگارمان دەکەین لەشساغی و تەندرووستی بەهەموو لایەکمان ببەخشی و پشتگیرکارمان بێ بۆ پەرستش و عیبادەتەکان لەو مانگە پڕ خێر و ڕەحمەتەی بۆ کردنی تەراویحەکان و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و وە خودا لەخۆڕازی کردن و بەخشیش و صەدەقە و خێرکردن لەو مانگەیدا.

## فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەمەزان

ئەو مانگە کەوا مانگی ڕەمەزانە مانگێکی یەکجار گەورە و مەزنە و مانگی ڕەمەزان مانگی عیبادەت و پەرستشە وە مانگی قورئانە مانگێکە بەڕاستی داندراوە لەلایەن خوداوە بۆ ڕووداوە گرینگەکان ئەو مانگەیە کەوا مانگی سەرکەوتنە مانگی فەتح و فتوحاتەکانە وە مانگی بەدر و ڕزگارکردنی مەککەیە وە ڕەمەزان مانگی تەراویحە کە ئەو مانگەیە قورئانی تێدا دابەزیوە ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ [1]﴾ وە مانگی خێر و بەرەکەت و إحسانە ، سووپاس بۆ خودای گەورە کە دووبارە هاتەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (إِذَا كَانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ) ئەگەر یەکەم شەو هات لەمانگی ڕەمەزاندا (صُفِّدَتِ الشَّيَاطِين) شەیطانەکان زنجیر دەکرێن (وَمَرَدَةُ الجِنّ) وە ئەو شەیطانانەی کە شەڕ و خراپەی دەکەن و کوورت هەڵهاتینە لەشەڕ و خراپەی ئەوانیش زنجیر دەکرێن ، (وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، فَلَمْ

[1] البقرة: ١٨٥

يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ) دەرگاكانی دۆزەخ دادەخرێن وتەنانەت یەک دەرگاشی ناكرێتەوە ، (وَفُتِّحَتْ أَبْوَابُ الجَنَّةِ ، فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ) وە دەرگاكانی بەهەشتیش دەكرێنە و تەنانەت یەک دەرگاشی داناخرێت، (وَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ، وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ، وَذَلكَ كُلُّ لَيْلَةٍ [1]) ئەوجار یەكێک بانگ دەكات { هەندێ لەزانایان دەڵێن فریشتەیەكە وە دەشڵێن شتێكی ترە} هاوار دەكەن ئەی ئەو ئەوانەی چاكە دەخوازن و دەتانەوێ ڕوو بكەنە خودای پەروەدگار{ كاتی خێر كۆكردنەوەیە كاتی ئەوەیە كەوا خێر و چاكە بەدەست بێنن و پەرستشی ئەنجام بدەن} ، وە ئەی ئەوانەی شەڕ و خراپەی دەخوازن گوناە و تاوانتان ئەنجام دەدا وەرن كورت هەڵبێنن لەوەی چاكەی بكەن و وازبینن و لێرەدا كۆتایی بە گوناە و تاوانەكانتان بینن ، وە خودا لێخۆشبوونی ڕزگاركردنی هەیە بۆ چەندی لەبەندەكانی(لەمانگی ڕەمەزاندا) لەهەر شەوێک لەشەوەكانیدا،(خەڵكێک و كۆمەڵێكی ڕزگار دەكات لەئاگری دۆزەخ) ، یارەبی خودای گەورە ئێمە لەوان بین و ڕزگارمان بكەی لە ئاگری دۆزەخ

## پێنج هەنگاوی كورت بۆ ڕازی كردنی خودای پەروەردگار ﷻ لە ڕەمەزان

هەنگاوی یەكەم : (الْمُحَاسَبَةُ وَالْمُعَاتَبَةِ) لەخۆپرسینەوە و وە خۆ سەرزەنشت كردن لەو گوناە و تاوانانەی كە ڕابردوو كەوا كردیتت لەخۆت بپێچیەوە و

---

[1] الترمذي (٦٨٢)، وابن ماجه (١٦٤٢)

لەخۆت بپرسیەوە چیت ئەنجام داوە لەژیانی ڕابردووت؟ لە کاتێ کە هەلت بۆ گونجاوە لە شوێنێک بەتەنیایی و هێمنی چیت کردووە؟ ، لەخۆت بپرسەوە و چاو بەسەر ڕابردووی خۆتدا بخشێنەوە و ئەو پرسیارانە بخە ڕووت بە دڵێکی فراوان لەخۆتی وەربگرە و وەڵامیان بدەوە ، ئایا تۆ لەمەسەلەی شیرک و کوفر هیچت لێ هاتبووە جێ لە ڕابردوودا؟ ئایا کوفرت کردبوو بە طاغوت ؟ ئایا تەوحید و خوا بەیەک گرتنت تەواو لەخۆت هێنابووە جێ؟ وە ئایا خوڕافیات و بیدعیەکانت ڕەتکردبۆە و وازت لێهێنابوو؟ لە گوناهەکان گەڕا بوویەوە ؟ خراپەکانت نەدەکرد حەڕامەکانت نەدەخوارد؟ ئەی نوێژ فەرضەکانت هەموویت بەڕێک و پێکی ئەداء کردبوو ؟ لەکاتەکانی خۆی واجب بینیە جێی بەسوونەتەکانیەوە ؟ ئایا لەکاتی خۆیدا بە دەستنوێژی ڕێک و پێکەوە نوێژەکانت ئەنجام دەدا؟ وە پاشان لەخۆت بپرسی بانگەوازی و دەعوت کرد بۆ لای خودای پەروەردگار لەڕابردوو ؟ فەرمانت کرد بە چاکە ڕێت گرت لە خراپە ؟ ئایا قورئانت دەخوێند ؟ زیکر و یادەکانی خودات دەکرد ؟ لەبیرت بوون؟ ئایا سووننەتەکانت ئەنجام دەدا؟ ئایا هەڵسووکەوتت چۆن بوو لەگەڵ خەڵکی بەگوێرەی شەریعەتی خودای پەروەردگار بوو ؟

جا کاتی ئەو پرسیارانەت لەخۆت کرد بە دڵنیاییەوە وەڵام بەدەست دەهێنیت جا ئەوکاتی یان بە باشترین شێوە وەڵام بەدەست دەهێنیت بەڵێ هەموویت بەڕێک و پێکی و بە تەواوی ئەنجام داوە ئەوا دەستخۆشی لەخۆت بکە و لەخۆبایی مەبە

بێگوومان لەفەضڵ و بەخششی خودای پەروەردگارە و لەویەوە بیزانە ، وە ئەگەر وەڵامەکەت بەهەندێکی باش و هەندێکی خراپ وەرگرتەوە لەخۆت ئەوا لەسەر خراپەکان بەسەر خۆتدا بڕۆوە خۆت سەرزەنشت بکە لەسەر ئەو خراپەیەی کە کردیتت و ڕووبکە رب العالمين لەخۆت بپێچەوە هێشتا کاتت لەدەست نەچووە ، وەکو پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب { رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ } دەفەرمووێ: (حَاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحَاسَبُوا [١]) واتە : محاسەبەی خۆتان بکەن و لەخۆتان بپرسنەوە پێش ئەوەی حیسابتان لەگەڵ بکرێ ، جا تۆ لەخۆت بپێچەوە چوویە دەنگدان ئەو دەنگدانەی شیرکی و کوفری ئەو دەنگدانەی فشە و گاڵتە بوو ئەو دەنگدانەی بەڵێ فرموودەی خودای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ و زانایانی وردبین و ئەهلی سووننەو جەماعە ئەوانەی خاوەنی تەوحید بوون و دوور بوون لە شیرک و کوفر کوفریان کردبوو طاغوت بەڵێ قسەیان وان تەواو دەرچوو و هاتە جێ ئەو دەنگدانەی کە شەقشەقەیەک بوو منداڵە نەزان و نەفامەکانیان پێ خافڵاند ئەوانەی پاشگری ئیسلامیان بەخۆیانەوە لکاندبوو یان خەڵکێکی نەزانیان پێ خافڵاند ، (پەنا بەخوای) کە ئەوەتا دووبارە پێیوە مەشغوڵ و سەرقاڵن ، بۆیە تۆش بەخۆتدا بچۆوە بزانە چیت کردووە لەپێش مردنێ بەهانا خۆت وەرە و مردنی بینە بەرچاوت ئەو کاتەی دەمری گیانت دەردەچی بێکەسی و کەسیش ناگاتە سەرت ئیللا عەمەل و کرادرە چاکەکانی خۆت نەبی بەکەلکت

[١] امام أحمد في ((الزهد)) (٦٣٣)، وابن أبي الدنيا في ((محاسبة النفس)) (٢)

دێی و لەهاناشت دێت ، بینە بەرچاووت ئەو ڕۆژەی لەبەرامبەر خودای ڕادەگیرێی و ئەو کەم و کوورتیانەت دەهێنێتە بەرچاووت ناشتوانی لەهیچیان نکۆڵی بکەی و زمان و دەست و قاچت و هەموویان دێنە وەڵام و شایەدی بەسەرتەوە دەدەن لەجیاتی شایەدیت بۆ بدات چونکە هەموویان درووستکراوو مەخلوقی خودای پەروەردگارن ، سەرنج بدە و تەماشا بکە ئەوڕۆژەی کەوا دۆزەخێک ئامادە کرایە ئێستا بیری لێ بکەرەوە و لە خودای بترسە کەوا ٦٩ جار گەرمیەکەی گەرمترە لە گەرمترین ئاگری دوونیای ، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (نَارُكُمْ جُزْءٌ مِن سَبْعِينَ جُزْءًا مِن نَارِ جَهَنَّمَ) واتە : گەرمترین ئاگری دوونیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم(قيلَ: يا رَسولَ اللَّهِ) هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتیان ئەی پێغەمبەری خوودا (إنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً) خۆ ئەگەر هەندی ئاگری دونیا گەرم بوایە هەر بەس بوو بۆ ترسان و ناخۆشی و زەحمەتی و ئێش و ژانی ، پێغەمبەرﷺفەرمووی : (فُضِّلَتْ عليهنَّ بتِسْعَةٍ وسِتِّينَ جُزْءًا) ٦٩ قات گەرمترە لە گەرمترین ئاگری دوونیا (كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا [١]) وە بەشێک لەو ٦٩ بەشەی هەندی گەرمترین ئاگری دوونیا گەرمە ، وەرە ئەوڕۆژەی بیننە بەرچاوت و خۆت سەرزەنشت بکە و بەسەر خۆتدا هەڕۆوە و هەنگاوی دووەم باوێ .

---

[١] البخاری - ٣٢٦٥

هەنگاوی دووەم : (التَّوْبَةُ مِنَ الذّنُوبِ وَالْإِقْلَاعُ عَنِّ الْمَعَاصِي) گەڕانەوە لەگوناه و تاوانەکان و پشت تێرکردنیان ، ئەی برا و خوشکی موسڵمان و سەنگین وەرە بگەڕێوە لای رب العالمين چونکە بای تۆبەکردن و وەرزی تۆبە کردن هات و هەڵی کرد بایەکە وەرە ڕوو بکە خودای گەورە و بڕۆ غوسلێکی تەوبە بکە یا دەست نوێژێکی بگرە هەرچەندە بەڵگە و فەرموودەی صەحیح لەسەر وەی نیە کەوا غوسل بکرێتن بۆ ئەوانەی تەنها گوناهکارن مەگەر کافر و موشریک بووبن لەپێشتر ئێستا بوبنە موسڵمان بۆ ئەو نەوعە تەوبانە یاخود دوو ڕکات نوێژی تایبەت هەبێ بە تەوبە بەڵام زانایان دەفەرموون خۆشووشتن لەپێناو رب العالمين و خۆپاک کردنەوە وە یان دەستنویژ گرتن و دووڕکات نوێژ لەخودات نزیک دەکاتەوە و لەپاش ئەو دوو ڕکات نوێژەی دەستت ڕووە و ئاسمان پان بکەوە و بەرزایی دەستەکانت بێتە ئاستی شانەکانت (ئەوەیان سوونەتیە) یان ئەوەی ڕووی دەستت بەرەو دەمووچاوت بێ ئەوجا لەخودای گەورە بپاڕێیەوە بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێبکە وە الحمدلله و سووپاسی خودا بکە وە پاشان صەڵاوات لێبدە لەسەر پێغەمبەری ﷺ وە بەدڵێکی خەمبارەوە و بەچاوێکی فرمێسکاویەوە لەبەر خوای خۆت بپاڕێیوە و ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە ڕابگەیەنە وەبیسەلمێنە کە خودات لەلا زۆر مەزن و گەورەیە و لێی دەترسێ ترست لێی هەیە وە پاشان بە (یا رحمٰن و یا رحِیم) (یا غَفَار و یا غَفُور) (ئەی خودای لێبووردە) لەبەری بپاڕێوە تا ئەوکاتەی چاوەکانت فرمێیسکی بکات و هەتا

هەناسەت لەبەردا مابی بڵێی ئەی خودای رب العالمین منی نەزان(خۆت بە کەم و هیچ نیشان بدە) وە بڵێ منی کەمتەرخەم منی گوناهکار یا رب العالمین لێم ببوورە و لێم خۆشبە تۆ خودای منی هاتیمە قاپیەکەت و کەسی تر نیە داوای لێ بکەم وە کەسیش تووانای نیە لێم ببووری تەنها تۆ نەبی وە لە ئاگری دۆزەخ بەدوورم بگرە و بەبەهەشتەکەت شادم بکە و لەگوناهەکان بمشۆرەوە و عەفووم بکە و لێم ببوورە ئەی خودای رب العالمین ، وە لەپاشان مەرجەکانی تەوبەی لێ بهینە جێ

## مەرجەکانی تەوبە :

١ - الْإِخْلَاصْ : یەکلایی بوونەوە بۆ خودا و تەوبەکەت تەنها بۆ خودا بێ و لەبەر خاتری هیچ کەس و لایەنێک نەبێ بۆ ئەوەی مەدحت بکەن و لێت بێ بە ڕیاء

٢ - الْإِقْلَاعُ عَنِّ الذّنُبْ : پشت تێکردن وازهێنان لە گوناه و تاوانەکانی پێشووت

٣ - الْعَزْمُ عَلَى عَدْمِ العَوْدَة : وە دووبارە پێدابگری لەوەی نەگەڕێییەوە سەر تاوان و گوناهەکان و دڵیشت دابمرکێ و پەشیمان بی لێی

٤ - النَّدْمِ : پەشیمان بوونەوە و دڵ هەرقرچانی تێدا بی و شانازی نەکەی بە گوناهەکانی پێشترت کاتێ بەبیرت دێتەوە و یان پێت دەڵێنەوە ئەوکاتە گریان و خەمناکی دات بگری پەشیمان بی لەوەی کردیتت ، کاتێ تەوبەکە بکە کە تەوبەی تێدا قبووڵ بێ ئەو کاتە نەبێ کە ڕووحت هاتبێتە گەردنت فیرعەون ئاسا بگەڕێیەوە لای خودای گەورە یان ئەو کاتە نەبێ کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهاتبێ

، جا بیر بکەوە ئایا گوناھ و تاوانەکەت مافی خەڵکێکت خواردووە یا جوێنت پێیان داوە یا لێت داون یا غەیبەتت کردوونە دەبێ بچیەوە لایان و گەردنی خۆتیان پێ ئازاد بکەی ئەگەر گەردنیان ئازاد نەکردی چی داوایان لێکردی ئەگەر شتەکە شەرعی بوو بیکە تا گەردنت ئازا بکەن تا لە دوونیا نەچوویە دەر و نەمردووی یا ئەگەر پارە و پوول و ئەمانەتێک و شتێکی کەسێکت لایە بۆی ببەیەوە و گەردەنی خۆتیان پێ ئازاد بکەی ، وەک خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ [١] ﴾، واتە : ئەی گەلی بڕواداران ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بگەڕێنەوە لای خودای پەوەردگار بە گەڕانەوەیەکی ڕاست و درووست و ڕێک و پێک (کە هەموو مەرجەکانی لێ بێتە جێ) و لەسەری بەردەوام بن بەڵکو خودای گەورە لە گوناھ و تاوانەکانتان ببووری و داپۆشێ و لێتان خۆشبێ وە بتانبا بۆ بەهەشتانێ کە بە ژێریەوە ڕووبارەکان دەڕۆن ، یان لەشوێنێکی تر دەفەرمووێ : ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ [٢] ﴾ واتە : بگەڕێنەوە لای خودای بە تێکڕایی و هەرهەمووتان ئەی گەلی بڕواداران ، مەشڵێ گوناھ و تاوانم زۆرە و گوناھەکانم گەورەن و بەشداریم کرد لە هەڵبژاردن و تازە قووڕم بەسەر چی بکەم ، بەڵێ دەرگای تۆبە دانەخراوە وەرە ئەگەر شیرکە یا کوفرە

[١] التحريم - ٨
[٢] النور - ٣١

یا تاوان و گوناهە هەر کامەیانە ئەوا تەوبە بکە ، وەک خودای گەورە دەفەرمووێ : ﴿ ۞ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ [1] ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ : ئەی ئەو بەندانەی خودای گەورە کەوا زێدەڕۆییتان کردووە بەسەر خۆتانەوە و گوناهـ تاوانتان ئەنجام داوە مەئیوس و بێ ئوومێد مەبن لەڕەحمەت و بەزەیی خودای گەورە چونکە بەڕاستی خودا لەهەموو تاوان گوناهەکان دەبووری (ئەگەر بگەڕێیەوە لای و تەوبەی لێ بکەی) وەبەڕاستی خودا لێبووردەی بەزەیی گەیەنەرە بۆ هەر کەسێکی کە بیەوێ ، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إلى اللهِ، فإنِّي أَتُوبُ فِي اليَومِ إلَيْهِ مِئَةَ مَرَّةٍ [2]) واتە : ئەی خەڵکینە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خودای گەورە ، من دەگەڕێمەوە لای خودای گەورەم ڕۆژانە سەد جار.

هەنگاوی سێیەم : خوێندنی قورئانی پیرۆز و خەتم کردنی ، ئەوەتا عبداللهی کوڕی عەباس دەفەرمووێ: (كانَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ أجْوَدَ النَّاسِ، وكانَ أجوَدُ ما يَكونُ في رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وكانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ في كُلِّ لَيْلَةٍ مِن رَمَضَانَ، فيُدَارِسُهُ القُرْآنَ، فَلَرَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ

---

[1] الزمر - ٥٣

[2] رواه المسلم - ٢٧٠٢

أجْوَدُ بالخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ [1]) واته : پێغەمبەری خودا زۆر بەخشندە و دەست کراوە بوو ، وە پێغەمبەر ﷺ لەڕەمەزاندا زیاتر لە جاران بەخشندە و دەستکراوەتر دەبوو ئەوکاتەی جبريل (عليه سلام) پێی دەگەیشت ، ئەو کاتەی جبريل (عليه سلام ) لەهەر شەوێکی ڕەمەزاندا قورئانی لەگەڵ دەور دەکردەوە و دەیخوێند ، جا پێغەمبەر ﷺ بۆ خێر و چاکەکان لە بایەکی هەڵکراوی بەردەوام کە هەموو شوێنێکی بگرتباوە لە بایەکە بەخشندە و دەستکراوەتر بوو لە ڕەمەزانانداا ، ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی دەفەمووێ :(ودَلَّ الحديثُ أيضًا على استحباب دراسةِ القرآن في رمضان، والاجتماع على ذلك[2]) ئەو حەدیثە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا قورئان لەمەزانانداا زۆر بخوێندرێ وە کۆببنەوە لەسەر قورئان خوێندنی ، چونکە جبريل(عليه سلام) لەڕەمەزانانداا دەهات قورئانی فێرە پێغەمبەرمان دەرکرد ﷺ وە دەشفەرمووێ(أن المدارسة بينَهُ وبينَ جبريلَ كانت ليلًا[3]) خوێندنی قورئان شەوانە بووە لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و جبریلی فریشتە(عليه سلام) وە دەشفەرمووێ (فدَلَّ على استحباب الإكثار من التِّلاوة في رمضانَ ليلًا؛[4]) ئەوەش ئەوە دەگەیەنی خێرتر و چاکترە شەوان زۆرتر قورئانی تێدا بخوێندرێ لە ڕەمەزانانداا پاشان دەفەرمووێ : (فإنَّ الليل تنقطِعُ فيه

---

[1] أخرجه البخاري - ٣٢٢٠

[2] لطائف المعارف – ص٣١٥

[3] لطائف المعارف – ص٣١٥

[4] لطائف المعارف – ص٣١٥

الشواغل، وتجتمع فيه الهمم ويتواطأ فيه القلبُ واللِّسانُ على التدبُّر [١] كما قال تعالى: {إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئاً وَأَقْوَمُ قِيلاً[٢]} واته : چونکه له شەوەکان خەڵک حەساوەترە کێشە و گیر و گرفت و کەسابەت و ئیش و کار و سەرقاڵیەکانی کەمترە وە هەم و غەمەکانی کۆدەبێتەوە و ئەوکاتەی دڵەکان باشتر دەکەونە سەر شتەکان و وە زمانەکانیش باشتر دەیخوێنێتەوە و باشتر دەتوانی لێی ورد ببیەوە وەک خودای گەورە دەفەرمووێ ( إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا[٣]) واتە: بەڕاستی خۆ پێگەیاندن لە شەودا قورسترە لە ڕووی کردارو باشترە لە ڕووی گوفتارەوە ، وە پێشەوا عبدالرزاق (رحم الله) دەفەرمووێ: (كان سفيان الثوري إذا دخل رمضان ترك جميع العبادة وأقبل على قراءة القرآن[٣]) سوفیانی ثەوری یەکێکە لە پێشینە چاکەکان هەر کاتێ ڕەمەزانی لێ دا بهاتایە و بچووبایە ناو ڕەمەزان وازی لە هەموو عیبادەت و پەرستشەکانی تر دەهێنا و ڕووی دەکردەوە قورئان حوێندن ، کەواتە زۆر خوێندنی قورئانی پیرۆز پیشە و کاری سەلەفی صاڵحە وە پێشەوا زوهریش لێی گێڕدراوەیە (كان الزهري إذا دخل رمضان يقول: إنما هو قراءة القرآن وإطعام الطعام[٤]) هەر کاتێ ڕەمەزان بهاتایە دەیووت ڕەمەزان بریتیە خوێندنەوەی قورئان بەتەنها و وە بەخشینی خواردنە بە

---

[١] لطائف المعارف – ص٣١٥

[٢] المزمل – ٦

[٣] لطائف المعارف – ص ١٧١

[٤] لطائف المعارف - ص ١٧١

خەڵکی ، وە ئیبنو ڕەجەب دەڵێ : (واعْلَمْ أن المؤمنَ يَجْتَمعُ لهُ في شهرِ رمضانَ جهادانِ لنفسِهِ: جهادٌ بالنَّهارِ على الصِّيامِ، وجهادٌ بالليلِ على القيامِ. فمَن جَمَعَ بينَ هذينِ الجهادينِ ووَفى بحقوقِهِما وصَبَرَ عليهِما؛ وُفِّيَ أجرَهُ بغيرِ حسابٍ [1]) جا بزانە بەڕاستی لە مانگی ڕەمەزاندا دوو شتت بۆ کۆدەبێتەوە کە بەربەرەکانێ نەفس و هەواو ئارەزووت بکات ، یەکەمیان ڕۆژوو گرتنە : کە بریتیە بەربەرەکانێ نەفست بەوەی خۆت ڕابهێنی لەسەر برسیەتی و تینوویەتیە لە ڕۆژدا ، وە دووەمیش: قیام و هەستانەوەیە لە شەودا بۆ شەو نوێژ و تەراویح و قورئان دەخوێنی و بەربەرەکانی هەواو ئارەزووت دەکەی ، وە لە هەمان کاتیش پاداشتی زۆری تێدا بەدەست دەهێنیت بۆ قیامەت و دوارۆژت

لە هەرووکیان فێرە سەبر و ئارامی دەبیت و پاداشتێکی یەکجار زۆری قیامەتی بەدەست دەهێنیت ئەگەر الإخلاص و یەکلایی بوونەت هەبوو بۆ خودا ، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ) ڕۆژوو گرتن و قورئان خوێندن دەبنە دوو تکاکار (لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) بۆ بەندەکان لە ڕۆژی دوایی (يَقُولُ الصِّيَامُ أَيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّهَوَاتِ بِالنَّهَارِ) ڕۆژوو دەڵێت پەروەردگار من خواردن و ئارەزووەکانم لێ قەدەغە کردبوو لەڕۆژدا (فَشَفِّعْنِي فِيهِ) من بکە تکاکار و تکای بۆ بکەم و لێی ببوورە ( وَيَقُولُ الْقُرْآنُ مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ

[1] لطائف المعارف – ص١٧١

قَالَ فَيُشَفَّعانِ[1]) وه قورئانی پیرۆزیش دەڵێت پەروەردگار منیش شەوان خەوم لێ قەدەغەکردبوو من بکە تکاکار و تکای بۆ بکەم و لێی ببووره ، خودای گەورەش دەفەرمووێ : ئەی ڕۆژووەکە و ئەی قورئانەکە تکاکار بن بۆی ، وه پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (یجيءُ القرآنُ یومَ القیامةِ کالرجلِ الشاحبِ) واته : قورئان دێت له ڕۆژی قیامەتدا له مەیدانی حەشر و حیسابدا وەکو پیاوێکی ئارەقەکار و ماندوو و هیلاک (أنا الَّذي أسهَرْتُ لیلَكَ) دەڵێ من بووم نەمدەهێشت شەوان بخەوی (چاوت لەسەر من بوو نەدەخەوتی) (وأظمَأْتُ نهارَكَ[2]) وه من وام لێکردبووی تینوایەتیت نەشکێت و بەتەواوەتی له ڕۆژان هەر تینوو بی (جا دەڵێ قورئانەکە بۆی دەبێته تکاکارو شەفاعەتکار)

هەنگاوی چوارەم : (دەستکراوەیی و بەخشندەیی و خێر کردن)وەکو له پێشتردا باسمان کرد که پێغەمبەر زۆر بەخشنده و دەستکراوەتر دەبوو له مانگی ڕەمەزاناندا زیاتر ، ابن رجب الحنبلی سەبارەت به فەرموودەیەکەی ابن عباس دەڵێت (وكانَ جودُهُ – صلى الله علیه وسلم - یَتَضاعَفُ في شهرِ رمضانَ على غیرِهِ مِن الشُّهورِ[3]) واته : پێغەمبەر ﷺ چەندبارەوه و زیاتر دەیبەخشی له مانگی ڕەمەران وەک لەمانگەکانی دیکه (کما أن جودَ ربِّهِ یَتَضاعَفُ فیهِ أیضًا[4])

---

[1] أخرجه أحمد ( 6626 )، وابن المبارك في ( (الزهد )) ( 114/2 )، والطبراني ( 72/14 ) ( 14672 )، والحاكم ( 2036 )

[2] أخرجه ابن ماجه ( 3781 ) واللفظ له، وأحمد ( 22976 )

[3] لطائف المعارف – ٣٨٦

[4] لطائف المعارف – ٣٨٦

هەروەکو چۆن بەخشش و بەخشینەکەی خودای گەورە  یەکجار زۆرە لە ڕەمەزانانداوەک لە مانگەکانی تر..

(وکان جودُهُ ﷺ بجميع أنواعِ الجُودِ) واتە پێغەمبەر ﷺ تەنها پارەی نەدەبەخشی بەڵکو لە هەمووبوارەکان و جۆرەکان دەیبەخشیەوە(مِن بذْلِ العِلْمِ والمالِ) عیلم و زانیاریشی دەبەخشیەوە (دەعوە و زانگەوازیشی دەکرد ) وە ماڵ و سەروەرت و سامانیشی دەبەخشی (وبذلِ نفسه لِلَّهِ تعالى) وە نەفس و گیانی خۆشی دەبحشی لەپێناو خودای گەورە (في إظهار دينه) لەسەر خستن و بەدیار خستنی دینداری و دینەکەی (وهداية عباده) وە لە ڕێنوێنی کردنی بەندەکانی خودای  پەروەردگار (وإيصالِ النفع إليهم بكلِّ طريقٍ ) بە هەموو جۆر و ڕێگایەکی دەیویست سوود بگەیەنێ بەخەڵکی  (من إطعام جائعهم) دەیویست برسیەکان تێر بکات چەندی لە توانایدا هەبێ  (ووعظ جاهلهم) نەزانەکان فێر بکات و پەند و وانەیان پێ ببەحشی ، (وقضاء حوائجهم) پێداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکات ئەوانەی  کە پێویستن ، (وتحمُّل أثقالهم[1]) وە بار قورسیەکانیان لەگەڵ هەڵبگرێ .

وەک لە صەحیحی مووسلیمدا هاتوە ئەنەس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ: (مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَلَى الإِسْلاَمِ شَيْئًا إِلاَّ أَعْطَاهُ) واتە : پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی لێ نەخوازراوە لەدوای ئەوەی ئیسلامەتی بۆ هاتیە و لەسەر

---

[1] لطائف المعارف – ص ٣٠٦

ئەوەی کەسێک پێوەی ببتە موسڵمان وتبی ئەوەم بۆ بکە ئیللا بۆی کردووە و پێی بەخشیە ،(فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَأَعْطَاهُ غَنَمًا بَيْنَ جَبَلَيْنِ فَرَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ أَسْلِمُوا فَإِنَّ مُحَمَّدًا يُعْطِي عَطَاءً لاَ يَخْشَى الْفَاقَةَ [١]) واتە : پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای مەڕ و ماڵاتی لێ کردوو و پێغەمبەرییش ﷺ پێی بەخشی جا پیاوەکەش گەڕاوە لای کەس و کار و ئەهلەکەی و وتی : وەرن خەڵکینە موسڵمان بن بەڕاستی چوومە لای محمدێکی ﷺ دەبەخشی وەکو ئەوەی هیچ فەقیر و هەژاری نەگرتە بەرچاو و لێ نەترسێ ، وەرن با ببەخشین لەپێناو خودای گەورە ئەوانەی کەوا دەنگیان داوە ئەوانە گوناهکارن ئەوانەی بیدعە و خوڕافیات دەکەن ئەونەی کافر و مووشریکن یان لەگەڵ طاغنوتەکاندانە یان لە بازنەی کوفرینە با بچین بۆلایان لەو ڕەمەزانانە پێیان ببەخشین و فێرە تەوحید و یەکخواپەرستیان بکەین چ بەپارە چ بە هەر پێداویستیەکی تر هەیانبێ بەس لەپێناو خودای گەورە بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕابکێشین و بێن بەرەو ئیسلام ببنە خاوەن تەوحید و کوفر بکەن بە طاغوت واز بێنن لە هەڵبژاردن و هەڵە و کەم و کورتیەکانی پێشتریان کەوا هەیان بووە ئەوکاتی ڕێگا و شوێنی پێغەمبەرت گرتیتە بەر ﷺ ، وەنەکەی بترسی لەوەی ئەگەر ببەخشی لەماڵت کەم دەکات و زەرەر دەکەی نا کەم ناکات وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ

[١] أخرجه مسلم (2312)

مَالٍ[1]) واته : هەر صەدەقە و بەخشینێک قەتا و قەت لەماڵ و سامانت کەم ناکات (بەڵکو زیادی دەکات)

وە پێغەمبەر دەفەرمووێ : (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا) واتە : غورفە و ژوورانێک هەن لەبەهەشتدا ئەودیو و ئەودیوی لێ دیارە (واتە لە لەدیوی ژووری هەموو دەرێی لێ دیارە وە لەدیوی دەرێ هەموو ژۆرێی لێ دیارە دیارە وەکو ئاوێنە وایە) (وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا) لە دەرەوەی ژوورەوە دیارە وە لە ژوورەوەش دەرەوە دیارە (فَقَالَ لِمَنْ) وتیان ئەوە بۆ کێیە ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ (قَالَ لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ وَأَدَامَ الصِّيَامَ وَصَلَّى لِلَّهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ[2]) واتە : پێغەمبەر ﷺ وتی ئەوە بۆ کەسانێکە کە قسەیان شیرن و نەرم و نیانە لەگەڵ خەڵکی لەکاتی دەعوە و بانگەوازی وە خواردن دەداتە ئەو خەڵکانەی کە پێویستیانە وە بەردەوام بی لەسەر ڕۆژووەکانی وە نوێژی بکات لەشەودا کە خەڵک خەوتوون ، جا برای بەڕێزم خوشکی موسڵمان بەکەمی مەگرە لەمانگی ڕەمەزاندا وەبکە خەڵکێک بەدەستی تۆ و لەسەر گیرفانی تۆ فتاری بکاتەوە و ڕۆژووەکەی بشکێنی (مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا[3]) واتە : هەر کەسێ وابکات ڕۆژوو گرێک فتار بکاتەوە و ڕۆژوو

---

[1] المسلم - ٢٥٨٨
[2] صحيح الترمذي – ١٩٨٤
[3] صحيح الترمذي – ٨٠٧

بشکێنی (بەدەستی وی یان لەسەر گیرفانی ئەو ) ئەوا ئەجر و پاداشتی ڕۆژووگرەکە بەتەواوی بۆ ئەو کەسە دەچێت کە وای کرد ڕۆژوەکەی بشکێنێ بە بێ ئەوەی لە ڕۆژووی ڕۆژووگرەکەی کەم بکاتەوە ، وە خودای گەورەش دەفەرمووێ : ﴿ مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ۗ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُۚوَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ[١] ﴾ واتە :نمونەی ئەوانەی کە ماڵ و سامانیان دەبەخشن لە پێناوی خوادا، وەکو تۆوێک وایە کە بڕوێت و حەوت گوڵی گرتبێت، لە هەر گوڵێکدا سەد دانەی تیادا بێت، خوایش بۆ هەر کەس کە بیەوێت (بە گوێرەی نیەتی و جێگرتنی خێرەکەی) پاداشت چەند بەرامبەر دەکات و خوا فراوانگیر و زانایە. ، هەرکەسێکیش ئەو کڕین و فرۆشتنەی لەگەڵ خودادا بکات بێگوومان خودای پەروەردگار لێی وەردەگریت و پاداشتی دەداتەوە

هەنگاوی پێنجەم : ڕۆژوو گرتنێکی ڕێک و پێک بە واجبات و سووننەتەکانیەوە وە خۆ بەدوور گرتن لەو شتانەی کە خێری ڕۆژووەکەت کەم دەکاتەوە ، وشەی (الرمضان) لە (رمض)یەوە هاتووە بەمانای گەرمایەتی بەرد دێت ( ئەوکاتەی هەتاو لە دەرێیە و بەردەکان چەند گەرم دەکات الرمضان لەوەیەوە هات لە کاتی گەرمایی (چونکە ڕەمەزان واجب و پێویست کرا لە مەککە و مەدینە و حیجازدا )

[١] البقرة - ٢٦١

جا ڕۆژووش لە زمانەوانی واتە خۆگرتن لە المصطلع و زاراوەشدا بریتیە لە : (الامساك على الطعام والشراب والجماع وما يفسده ويبطله) واتە : خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە و سەرجێی کردن ( بۆ ڕوونکردنەوەی شەرعی شەرم لە ئایندا نیە ) وە لەو شتانەی کە بەتاڵ و پووچەڵی دەکاتەوە ، جا تۆ یەکمجار نیەتی تێدا بینە نیەت تێیدا واجب و پێویستە بۆ بەڕۆژووبوون (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ[1]) واتە : هەموو کار و کردەوەکان بە نیەتە ، نیەتی ڕۆژووە فەرزەکان دەبێ بەشێکی شەو مابێ و نوێژی بەیانی نەبووبێ نیەتەکەت لێ هێنا بی ئەگەرنا ڕۆژووەکەت لێ وەرناگیرێ ، (مَنْ لَمْ يُبَيِّتْ الصِّيَامَ مِنْ اللَّيْلِ فَلا صِيَامَ لَهُ[2]) واتە : ئەوەی لەشەودا نیەت نەهێنێ و (بەشی شەو نەمابێتەوە و نیەتی هێنابێ) ئەوا ڕۆژووەکەی بۆ قبوڵ نیە و وەرناگیراو نیە .

## ئەو سووننەتانەی کە زیاتر پاداشتی ڕۆژووەکەت زیاد دەکات بریتین لە:

١ . زوو ڕۆژوو شکاندن وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ[3]) واتە : خەڵکی هەر لە خێر و چاکەدان مادەم ڕۆژووەکانیان زوو دەشکێنن وە ئەنەسیش ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ (لم يكنْ يُصلي المغربَ حتى يفطرَ ، ولو على شَربةٍ من ماءٍ[4]) واتە : ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی

---

[1] صحيح البخاري (١) صحيح المسلم (١٩٠٧)
[2] النسائي (٢٣٣٤)
[3] صحيح البخارى – ١٩٥٧ ، وصحيح المسلم – ١٠٩٨
[4] صحيح الجامع – رقم الحديث أو الصفحة: 4858 – أخرجه البزار (7127)، وأبو يعلى (3792)،

مەغریبی ئەنجام نەدەدا و نەیدەکرد هەر کە بانگ (مەغریب) دەبوو هەتا ئەگەر بە قومە ئاوێکیش با ڕۆژیەکەی نەشکاندبا .

٢ . ڕۆژوو شکاندنت با بە خورما یا ڕوتەبی بێ یا بە قەسپ بێ یا بە ئاو بێ ئا ئەوەیان سوونەتیە وەک ئەنەس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەگێڕێتە دەفەرمووێ : ( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ) واتە ئەنەس دەفەرمووێ پێغەمبەر ﷺ بە چەند ڕووتەبێکی ئەگەر هەبا ڕۆژووکەی دەشکاند (.کە زانایان دەفەرموون ویتر بی یا یەک یا سێ یا پێنج بێ با تاکیش بێ کە ڕۆژووەکەتی پێ دەشکێنی) پێس ئەوەی نوێژ بکات ( فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ) وە ئەگەر ڕووتەب نەبا پێغەمەر ﷺ بە قەسپی وشک ڕۆژووی دەشکاند (فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ[١]) ئەگەرنا چەند گۆمڵێک لە ئاوی هەڵدەگرت و ڕۆژووەکەی خۆی پێ دەشکاند (واتە: چەند فرێکی لە ئاو دەخواردەوە) ،

٣ . دووعا کردن لەکاتی فتار و ڕۆژوو شکاندن کە (اللَّهمَّ لَكَ صُمتُ وعلَى رزقِكَ أفطَرتُ ، فتَقبَّلْ منِّي ، إنَّكَ أنتَ السَّميعُ العليمُ[٢]) یان (ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ[٣]) ئەوانە لەدوعاکانی پێغەمبەرن ﷺ یان دەتوانی خۆت هەر ڕاز و نیازێکت لە دڵدا هەبێت داوای بکەی لەخودای گەورە

---

[١] أخرجه أبو داود (٢٣٥٦)، والترمذي (٦٩٦)، وأحمد (١٢٦٧٦)

[٢] حديث ضعيف

[٣] أخرجه أبو داود (2357)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (3329).

٤ . پاشێو کردن کە سوونننەتە و خەیرە کە ئێمە جودا دەکاتەوە لە ئەهلی کتاب وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً[1]) واتە: ئێوە پارشێو بکەن چونکە لە پارشێوان خێر و بەرەکەتی تێدایە ، وە هەوڵبدە پارسێوەکەت تاخیر بکەی پێشی بانگ دان بە دوو سێ خولەکێک بخۆی و بخۆیەوە تا خێرت زیاترە و باشترە وەک پێغەمبەر فەرمووی : (لا تزالُ أُمَّتِي بخيرٍ ما عجَّلُوا الفِطرَ وأخَّرُوا السُّحورَ[2]) واتە : ئوومەتی من هەر لە خێردا دەمینێنەوە بەردەوام مادەم فتار زوو دەکەنەوە و پارشێوەکانیشیان دوا دەخەن و تاخیر دەکەن ، (تسحَّرْنا معَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ ثمَّ قمنا إلى الصَّلاةِ قلتُ كم بينَهما قالَ قدرُ قراءةِ خمسينَ آيةً[3]) ئەنەس دەفەمەرمووێ : لە لای پێغەمبەر ﷺ پارشێومان دەکرد و بۆ نوێژێک دەچووین وتیان نێوانی نوێژەکە و پارشێوەکە چەند بوو فەرمووی بەقەدەر پەنجا ئایەتی قورئانی کەوا بیخوێنی (یانی زۆر نزیک بووە لە کاتی بانگدانی بەیانیەکە و نوێژکردنەکەیان واتە (لەبەشە هەرە کۆتاییەکەی پێش نوێژی بەیانی بووە ) بۆیە لەو کاتە خواردن و خواردنەوە خێر و بەرەکەتی پتر و زیاترە. ئەی خوشک و برایان ئەی ئەوانەی گەیشتن بە مانگی ڕەمەزان وەرن ڕۆژووەکانتان بێ خێر مەکەن بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (

---

[1] أخرجه البخاري (١٩٢٣)، ومسلم (١٠٩٥)

[2] : إسناده ضعيف وهو صحيح دون قوله " "وأخروا السحور" . كما رواه الشيخان

[3] أخرجه البخاري (٥٧٥)، ومسلم (١٠٩٧)، والترمذي (٧٠٣)، والنسائي (٢١٥٥)، وابن ماجه (١٦٩٤) واللفظ له، وأحمد (٢١٧١٥)

من لم يدَعْ قولَ الزُّورِ والعملَ بِهِ ، فليسَ للَّهِ حاجةٌ بأن يدَعَ طعامَهُ وشرابَهُ[1])
واته : هەر یەکێ واز نەیێ لە قسەی درۆ و دەلەسە و خراپە و گوناه و تاوان و قسەی بێمانا لەسەریشیدا کاری پێدەکرد ئەگەر وازی نەهێنا خودای پەروەرگار پێداویست نیە بۆ کەسێکی تەنها کە وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنابێ بەڵکو دەبێ وازی لەو گوناه و تاوانانەش هێنابێ و ڕۆژووەکە کاری تێکردبی ، یان فەرموویەتی (لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ) لەخواردن و خواردنەوەی نیە ڕۆژوو گرتن و خۆگرتن (إِنَّمَا الصِّيَامُ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ) بەڵکو ڕۆژووی تەواو تەنها (بۆ ئەوەیە دوور بیت) لەقسەی پڕو پوچ و تاوان و شەهوەت بازیی ، (فَإِنْ سَابَّكَ أَحَدٌ أَوْ جَهِلَ عَلَيْكَ فَلْتَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ [2]) ئەگەر کەسێک هەڵەی لەگەڵ کردی و نەفامانە لەگەڵت جوڵاوە و جوێنی پێدای ئەو کاتی بڵێ من بەڕۆژووم. بۆیە تۆ لەوانە مەبە کە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیش شوێن هەواو ئارەزوو و شەهوەتەکانی دونیا کەوتوون و قیامەتیان لەبیر نیە ، چونکە ئەوانە ئەگەر نەیەنەوە سەر ڕێگەی ڕاست بەڕاستی زەرەرمەندی دوونیا و قیامەتـــــــــن

[1] أخرجه البخاري (١٩٠٣)، وأبو داود (٢٣٦٢)، والترمذي (٧٠٧) واللفظ له، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (٣٢٤٦)، وابن ماجه (١٦٨٩)، وأحمد (١٠٥٦٢)
[2] ابن حبان (٣٤٧٩)، والحاكم (١٥٧٠)

## کۆتــایــی

لەکۆتاییەکەیدا بەڕێزان و خۆشەویستان لەبەر خودای خۆمان دەپاڕێینەوە دەڵێین خودایە مانگی ڕەمەزانی ئەوساڵ بیکەیە خێر و بەرەکەت بیکەیە مایەی سەرکەوتن لۆ موسڵمانان ئەوانەی خاوەن تەوحیدن و دوورن لەشیرک و هاوبەشی وە دڵی موسڵمانان ئۆقرە بگری وە خودایە لەشساغیمان پێ ببەخشی لەسەر عیبادەت و پەرستشەکان بمانگەینە شەوەکانی کۆتا لەنێو دە شەکەوەش شەوی (لیلة القدر)ـمان بەنسیب بکەی یا أرحم الراحمین

آمین

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبيه اجمعين**